## شیعر

د.نوزاد یحیی باجگر

هەولێر - کوردستان

2021

ناوی کتێب: مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ
بەرگ: بەرگی دووەم
نووسەر: د.نوزاد یحـیی باجگـر
دیزاینەر: سمیه مرادی
بڵاوکراوەی: زانکـۆی جیهان/ جیهان پرێس28
چـاپ: چاپی یەکەم (2021) هەولێر

بۆ داونلۆدکردنی ئەم کتێبانە بە بێ بەرانبەر لەم ماڵپەرانە دەست ئەکەوێت

www.nawzadbajger.org
www.nawzadbajger.net
chairman@cihanuniversity.edu.iq

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان | وەزارەتی رۆشنبیری
ژمارەی سپاردنی(196)ی ساڵی (2017)ی دراوەتێ

سوپاسنامە

* بۆ رۆحی دایکم.. و.. باوکم

* و خێزانم.. منداڵەکانم.. نەوەکانم

* و بۆ هەموو عاشقان.. هەموو چەشن

د. نەوزاد باجلان
٢٠٢٠/١٢/١٥

# د. نەوزاد یحیـی باجـکـر .. لە ئەرشیفی بیـرەوەریمـدا

د. وریـا عمـر امـین

من زۆر لە نزیکەوە د. نەوزاد دەناسم ، چ وەك هاوڕێییەکی دێرین ، چ وەك خزمێکی نزیك.
د. نەوزاد لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە یێکێ بوو لەو ڕۆشنبیرە ئەدەبدۆستانە کە خولیای خوێندنەوە و نووسینی کوردی و کوردایەتی بوون..خۆشی لە شیعرێکیدا بە بۆنەی مردنی ( سامی شۆڕش ) ـەوە باسی ئەو ڕۆژانەی خۆی دەکات و دەڵێ:

سامی ..ئەی شۆڕش
بحەسێوە...بحەسێوە...بحەسێوە
لە سکونی موتلەقدا
لە یادمە ١٩٦٥
لە گازینۆی سیروان لە بن قەڵا
گەنجان ... دۆمینە و تاوڵە
ئێمەش کوردایەتی ئازارمان بوو
مڵاکی چای ناو پیاڵە
ئاوازی ئەی ڕەقیبمان بوو
کوردستان لە هەولێرەوە پێڕەومان بوو
....
هەر ئەڕۆین .. ئەڕۆین .. ئەڕۆین
ڕێگامان مەرگمانە
دروستکردنی ئاوەدانیی کوردستانمانە

وا بوو لە کولێژی پزیشکیی زانکۆی مووسڵ وەرگیرا و لە ساڵی ١٩٧٤ بوو بە پزیشك ... بەمە نەختێ لە بوار دابڕا بەڵام وازی لێ نەهێنا. پەیوەندی و عیشقی بۆ ڕۆشنبیری و وشەی کوردی بەردەوام بوو.. لە ساڵی ١٩٨٧ خوێندنی باڵای لە زانکۆی بەغداد تەواوکرد و بوو بە پسپۆر لە نەشتەرگەریی دڵدا کە لە بوارە هەرە زەحمەت و سەخت و ترسناکەکانی نەشتەرگەرییە ...ماوەیێك لە بەغداد خەریکی پزیشکییاتی بوو ..پاشان گەڕایەوە هەولێر و ڕووی کردە کارکردن لەگەڵ براکانی.

د. نەوزاد یێکێکە لە خێرخوازە دڵفراوانە پەخشندە هەرە چاڵاکەکانی کوردستان و شاری هەولێر .. کوردپەروەرێکی جەرگسۆز و دڵسۆزە ..عیشقی بۆ زانست و ڕۆشنبیری و خزمەتکردن و ئاوەدانکردنی کوردستان وای لێ کردووە توانینە ئابوورییەکەی خۆی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵ تەرخان بکات و چەند دەزگاییێکی خزمەتگوزاری دامەزرێنێ .. دیارترینی ئەمانە زانکۆی جیهانە لە شاری هەولێر ، پاشان لە سلێمانی و دهۆکدا..

زانکۆی جیهان گەورترین و پێشکەوتووترین و شەکاوەترین زانکۆکانی جیهانی سێیەمە..تەلارێکی زانستیی بەرزی سەرکەشە.. گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێ لە بڵاوکردنەوە و بووژانەوە و پتەوکردنی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری و وشیاریی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا..

د. نەوزاد وەك من بیناسم مرۆڤێكی لە ڕادەبەدەر چالاك و بە توانینە..مێشكێكێكی دینامێكیی هەیە لە ئەنجامدانی كارەكانی..دەیان دەزگای گەورە بەڕێوە دەبات...ئاگادارم ڕۆژێ بە لای كەمی ١٢ سەعات بێ وەستان كار دەكات و بێ ئەوەی هیچ هیلاكبوونێكی پێوە دیار بێ.. سەرەڕای ئەم هەموو بێ كاتی و سەرقاڵییە لە ڕادە بەدەرەی موچڕكی هونەر و شیعر و ڕۆشنبیری بەری نەداوە و بەردەوام بە گیانیا دەگەڕێ.. كتێبخانەیێكی گەورەی كتێبە كوردییەكانی لە ماڵەوە پێكهێناوە كە بە سەدان بەڵگەنامە و دەسنووسی بە نرخ و دەگمەنی تێدایە... مۆزەخانەی ماڵی فۆلكلۆری كوردەواری و سەنتەری ڕۆشنبیری و دەزگای بڵاوكردنەوە و سەنتەری بەڵگەنامەكانی مێژووی كوردی دامەزراندووە.ئیزگە و كەناڵی تەلەفزیۆنی كوردیی تایبەتیی خۆی هەیە..چالاكەوانێكی ژینگەییە ، بە هەزاران نەمام و گوڵ و درەختی لە چیمەنەكانی زانكۆكە و شوێنی تردا ڕواندووە ..و گەلێ جموجۆڵی تری ڕۆشنبیری و زانستی و كۆمەڵایەتی و پەروەردەیی. دەستی یارمەتی درێژدەكات بۆ هەر كارێكی ڕۆشنبیری و پشتگیریی دەكات.. لە ڕاستیدا ئەوەی د. نەوزاد بۆ بواری زانست و ڕۆشنبیریی كوردیی كردووە كەموێنەیە . لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوام دەخوێنێتەوە و شیعر دەنووسێ و تابلۆ دەنەخشێنێ . تا ئیستا ٦ بەرگی بڵاو كردۆتەوە بە دەرهێنانێكی جوان و چاپێكی قەشەنگ و ڕازێنراو بە تابلۆكانی خۆی. لەگەڵ ئەلبۆمێكی گەورەی تابلۆكانی دەركردووە... شایانی باسە كە هەندێ لە تابلۆكانی بیردەربڕی سەرنجڕاكێشن.

سەبارەت بە شیعرەكانی ، د. نەوزاد بە زمانی كوردی و عەرەبی دەنووسێ ..زۆربەی بابەتەكانی لەبارەی خۆشەویستیی نیشتمان و پرسی ژیان و بوون و مردنە. ئەم شێوازە شیعرییەی د. نەوزاد لە ئەدەبی جیهانیدا باوە و بە **Telegramic Poetry** (شیعری برووسكەیی) ناودەبرێ.. تێیدا بە یەكدوو دێڕ بە لادانی زمانی و لۆژیكی و دەربڕینی لێڵ و نامۆ سەرنج ڕادەكێشێ. ئەم جۆرە نووسینە لە ئەدەبی كوردیدا بەرچاو ناكەوێ ... شیعرەكانی د.نەوزاد سەر بەم (ژانرەن). سۆز و ناسكی و بیری وردیان لێ بەدی دەكرێ. ئەمە لە لایێك ..لە لایێكی ترەوە شیعرەكانی د. نەوزاد سەرنجێكی زۆری ڕاكێشاوە و زۆر كەس بە دوایا دەگەڕێ .. بە (پێوانەی جیهانی) ش ئاستی هەر شتێك لە هەر بوارێكدا بە پێی ڕێژەی داواكردنیەتی. بە چ پێوانەیێك ئاستی گۆرانییێك یا فیلم یا شانۆ یا كتێبێك هەڵدەسەنگرێت؟ وەڵامەكەی لەوەدایە بە ژمارەی داواكردن و ڕوو تێكردنیان... گەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری شیعرەكانی د. نەوزاد بكەین دەبینین ژمارەیێكی یەكجار زۆر خوێنەر بە پەرۆشەوە لێیان دەگەڕێن ، كە ئەمە خۆی لە خۆیدا هێما و پێوانەیە.

د. نەوزاد گەلێ دەربڕین و وێنەی شیعریی سەرنجڕاكێشی هەیە كە مایەی تێڕامانن و دەچنە بواری جەدەلییەتەوە ..بە تایبەتیی ئەوانەی لەبارەی پرسی فەلسەفیی ژیان و مردنن .. و هەندێ دربڕینی بوێرانەشی هەیە لە بارەی بوون و كردگار كە لە كۆمەڵە شیعرییەكانی (فی اللّٰه) و (الموت) دا بەرچاو دەكەون. لەوانەی ئیستا لە بیرمە ، كە لە شیعرە عەرەبییەكانییەوە وەرگیراوە:

ئەمەوێ مردن لە مردن تێركەم
تا مردن تێر بێ لە مردن

***

ساڵەها هەوڵم دا وێنەیێك بكێشم واتای نەبێ نەمتوانی

***

پەیژەكانی سەركەوتن بەرەو بێ پایانی
لەوێوە پایانی دەست پێ دەكات

د. وریا عمر امین

# مامۆستائەڵێ

یان مامۆستا دبێژیت... چ دبێژیت، هەتا نە چییە د ناڤ کەسایەتییا مرۆڤیدا باش فێرنابییە ئەلفوبێیا نیشتمان پەروەرییێ د گێرانا ئاخێ مامۆستا د ئەڤان بەرگاندا دبێژیت ب ستایلەکێ تازە و ب شێوازەکێ شیعری و ب سەلیقەکا زێدە جوان و ب زمانەکێ سادە و ساکار د هەمی ئەڤان پەندێن خوەدا مە دکێشیتە ڤیانا وەلاتی و ڤیانا مرۆڤان، لەورا ب هەستەکێ نیشتمان پەروەری وانەیێن خوە دبێژیت، نە شاعرم نە هونەرمەندم لێ خواندنا من بۆ ئەڤان پەندان مامۆستا هەم شاعیرە و هەم هونەرمەند، بەلکو زێدەتر زانا و ژیهاتی و مێشك دەولەمەندە، جاران مامۆستا وانەیان دبێژیت و جاران وەفادارییا خوە بۆ کەس و کار و عەردێ لێ مەزن بووی، هەڤلێرێ دکەتە ئارمانج و بەردەوام د لێگەریانێدایە بۆ روناهییەکا ئەبەدی، ئەوژی نیشتمان و سەربەخۆیا وەلاتییە، ل ئەڤێرێ جهێ ئاماژێیە بێژین، کو مرۆڤە یێ ئەڤان شیانێن دارایی و بەرنیاسی کو دەولەمەند و پزیشك ب ئەڤی ڕەنگی مال و ملکێ خوە بکەتە د خزمەتا گەل و مللەتی دا، وەکو شاعێرەکێ ژیهاتی و ڕەوشەنبیرەکێ مەزن و هەر کەسێ بۆ جارا ئێکێ شعرێن دیوانا مامۆستای (ئەڵێ) بخوینیت دێ وەسا هزر کەت زێدە د سادەنە، لێ ب دیتنا من ژ کویراتییا دلی دەردکەڤن، ژ حەزەکا مەزنا ئاخ و وەلاتی دەردکەڤن.
ل ئەڤێرێ دکتۆر (نوزاد یحیی باجگر ) چەندین پەیام ئێن مەزن هەم وەکو هەلویست و هەم وەکو ئامۆژگاری بۆ کەسانێن نیشتمان پەروەر بۆ ئەڤی نەوەیێ تازە کو بزانن ئەڤ سەربەخۆیە و ئەڤ ئارامییە و ئەڤ ئالایە ژ ئەنجامێ شورەش و بەرخودانێ هاتینە.
پەیڤێن شرینێن دکتۆری بکارهینانەکا هونەرییا بلند، هەمی دەربرینێ ژ ڕاستییێ دکەن، نەخاسمە دەمێ دبێژیت:

ڕاستی..... بلێ
ئەگەر........ بشمری

بەلێ، مامۆئێاڤاهییێ خوە ل سەر ڕاستییێ ئاڤاکرییە، دیسا هەتا مرۆڤ نێزیك نەبیت مرۆڤ نازانیت کو چ ئالی نەماینە دکتۆری ئیشارەت پێ نەدای، هەمی ژی دکەڤنە د چارچوڤێ زانین و زانست و پەروەردێدا و دبێژیت: (خوێندن بەنرخە) بەلێ مامۆستا، هەر چییا تە د ئەڤێ دیوانێدا گوتی یا ب نرخ و بهایە و ئامۆژگارییێن ب بهانە، ئەز دبینم هەر بەیتەکا شعرێ کەڤالەکێ جوانە و یێ کاریگەرە و ژ هەژییە ل هەمی ژورێن قوتابخانا و مالان بهێنە هەلاویستن، تێر بژین و تێر تەمەن بن.

پرۆفیسۆر دکتۆر
ئیبراهیم ئەحمەد سمۆ

# خوێنەری خۆشەویست ..

ئەو کۆبەرهەمەی بەر دەستت (مامۆستا ئەڵێ)، بەرهەمی هزر و بیری (د. نەوزاد یەحیا باجگر)ە، لە شێوە و ناوەڕۆکی شیعری ئازاددا گوزارشتییان لێ کراوە. ئەم شیعرانە دەچێتە نێو خانەی برووسکە شیعرە یا (شیعری برووسکەیی Telegramic Poetry یا وێنەی شیعری ، شیعری وێنەیی سەرنج ڕاکێش . هۆکاری سەرنج ڕاکێشی شیعرەکان بۆ گەلێك هۆ دەگەڕێتەوە، بەکورتی بەم شێوەیە شرۆڤەیان دەکەین.

ئەم کۆبەرهەمە شیعرییە (مامۆستا ئەڵێ)، دوای ئەزموونی شیعری (فی اللە، الموت، کوردستان، پێشمەرگە، وشە دەچێنم، أزرع الکلمات، زنجیرە پەرتوکی کودستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا) دێت، بریتییە لە چەندین بەرگ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەرهەمی تێڕامانی هزرن لە بواری فەلسەفەی بیری مرۆڤایەتی و لە تێگەیاندنی بەرامبەر لە پەیامی هزردا بۆ بنیاتنانی مرۆڤ و نەشونوماکردنی وەرگر، ئەوەیان لەناوەڕۆکدا.

لە ڕوخساریشدا شیعرەکان گرنگ نین سەر بە چ ژانرێك بن، لای ئەوی شاعیر شێواز خۆیەتی و شوین پێی کەسی پێوە دیار نییە و لە کەس ناچێ خۆی نەبێ، هەروەك ڕەخنەگری فەرەنسی (جۆرج بۆفۆن) گوتەنی: مرۆڤ خۆی شێوازە. لەم شیعرانە و سەرجەم شیعرەکانی (د. نەوزاد) دا هەست بەو بۆچوونە ڕەخنەییەی شێوازی هونەری گوزارشتکردن دەکەین.

لەکاتێکدا لە ئەدەبیاتی مرۆڤایەتیدا نموونەی شیعری (جاك بریفەر ووالت ویتمان و شیعری هایکۆی یابانی) و لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردیشدا شیعری چوارینە و پۆستەرە شیعر و برووسکە شیعر سەر بەو ژانرەن کە (د. نە وزاد یەحیا باجگر) شیعرەکانی بەلادانی زمان و دەربڕینی لێڵ لە هەندێ گوزارشتدا سۆزو ناسکییەکی دیکەی بەخشیوە، سەرباری بوێری لە دەربڕین نووسیندا و نەهێشتنەوەیان بە ناکامی لە نێو ناخ و زاردا.

بوێـری و سـادەیی لـە دەربڕینـدا گـەر خاسـیەتی هونـەری شـیعری ئـەو بێـت، مەبەسـت لێـی لای خـودی د. نـەوزاد یەحیـا باجگـر چ لەشـیعرەکانی یـا تابلـۆ هونەرییەکانیـدا ئاسـوودە بوونـی نـاخ و بیـرە لـەو جەدەلییاتانـەی کـە هـەر دەبـێ گوزارشـتیان لـێ بکرێـت، بـۆ ئـەم هەژانـەی نـاخ و هزریـش لـە مێـژە گوتویەتـی:

نە شاعیرم، نە هونەرمەند

مێشکی خۆم دەکەم دەوڵەمەند

بەگشـتی ناوەرۆکـی شـیعرەکانی (د. نـەوزاد) دەچێتـە نێـو بابەتـی خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ نیشـتیمان، بـۆ زانسـت و تێکۆشـان و بنیاتنانـی خـود و پێگەیشـتن لـە تێگەیشـتندا، پرسـی ژیـان و مـەرگ و مانـەوە لـە نەمرییـدا بـە کار و کـردەوەی چـاك، هـزری داهێنـەر و بنیاتنەرانـە، نابـێ ئـەوە لەبیـر کەیـن لای ئـەوی ئەفرێنـەر هەمـوو شـتەکان واتایـان هەیـە: ئەوەشـیان ترۆپکـی گەیشـتنی بـە مانایـە بـە مەبەسـت، سـەیرکەن چەنـد جـوان گوزارشـتی لـە بـێ مانایـی کـردووە:ـ ساڵەها هەوڵمـدا وێنەیـەك بکێشـم واتـای نەبـێ، نەمتوانـی.

د. محەمەد خدر مەولود

زانکۆی جیهان

هەولێر ٢١-١٢- ٢٠١٦

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ماموستا ... دەروونی
لە سروشت وەردەگرێت

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خەوتن ... خەوی ئەخوێنێ
ئاهەنگ ناخ ئەجوڵێنێ
جوڵانی ناخ ... ئاهەنگ ئەدوێنێ
ئاهەنگ و ناخ براو دۆستن

27/3/2014

# مامـۆستا ئـەڵێ

یادت ... حەیران .. و قەتاری
دەربەدەری ... ژیانمە
یادت ... ڕۆژی رووناکی
سەربە ستی ... ئاواتمە
یادت .. بەختیاریمە .. سە خلەتیمە

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

بە برسیاتیت .. تێر ئەبم
لە فەقیربوونت .. برسی ئەبم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

لای لایەت بۆ ئەکەم
بەڵکو خەوت ... دێنێتەوە
ڕانم سەرین
ئەنگوستەکانم شەنە
لای لایەت  بۆ دەکەم
بەڵکو مێشکم ببوژێتەوە
لە خەو بتبینم

29/3/2014

## مامۆستا ئەڵێ

هەر شتێك هەیە .. پێشمەرگە هەیە
ئێمە .. ژینی جەنگ نین
ئیمە چنینی ئاوەدانین

28/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

سوپاس بۆ خوا
بۆ خوێتی شەهیدان
لە ژیانم دیم
فرۆکەوانی کوردستان
پیرۆزە ... زاگرۆس

28/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

وڵات ئەبێ ئاوەدان
تەنیا بە هاوڵاتیان
ئەوانی دی هاوپەیمان

28/3/2014

## مامۆستا ئەڵێ

ئایا بیرم ... لە مێشکمە؟
یان .. مێشکم هی بیرمە!
فکر .. و .. مێشك
هاوکارن

3/1/2014

تریلە بارم ... پێیە
بە خێرایی لێئەخورم
بیگەیە نمە جێ ... پێش ئەوە ی بێ
سوود بێ
ئەوانەی لە کەنار ڕاوەستاون
ئەڵێن رایگرن
زۆر زۆر خێرایە
مۆڵەتی لێوەرگرن

28/2/2014

# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی چاکە مەکەن
لە ئاسمان بێتە خوارێ
ئەبێ دروستی بکەین
بیبەخشین و قبووڵ بکرێ

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەگەر دەتوانین
گورگ .. مەڕ .. بلەوەڕێنین!
با لەناو خۆمان
بیانخەوێنین

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

نازانم چەند گورگ
لەناو خۆم بەخێو دەکەم
هیچیان نەدەمێ بیخۆن
خۆم دەخۆن
منیش .. دەگورگێنن

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەگەر توانای خوڵقاندنی توانەوەم نییە
با توانای خوڵقاو بدۆزینەوە

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

لە ڕێگای ڕۆمان ...
ئەی .. هێلکە خۆرینە
بزانن هێلکە بۆچی دروستکراوە

1/3/2014

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

بۆ یەکتر... ببینە
مامۆستا

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

من پەری نیم
شەیتانیش نیم
مرۆڤی ئەم ژینەم
ئەوەی تێیدایە
تێمدایە

1/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

هێزم هەیە...
کە خۆشەویستیم هەیە
خوام هەیە
کە بڕوام هەیە
بڕوا.. هێزی خۆشەویستی خودایە

28/3/2014

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

فیکر .. یەکێتی یەکە
جیاوازییان ... مامۆستایە تی
کاری ناسینی فیکر بکەین
نەك مامۆستا

30/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بڕوا دەکەن
دڵۆپە ئاوێك وزەی ئەوەندە تێدایە
دونیا دەڕوخێنێ
ئەگەر سکونی ئۆتۆمی لێ بسێنی

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

دروستکردنی منداڵ، خێزان، وڵات
چاکترین وەبەرهێنانە
لە دونیا .. و .. قیامەت

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تاوانی خۆمان بدۆزینەوە
دادی خۆمان بکەین
پێش یاسا

1/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بەردی ناو بەفر
پەنگری تەقینی ڕۆژ بوو
خاوەنی هێزی چاوم بوو

28/2/2014

پێم ئەڵێ
دەڵێن .. ڕەنگی چاومت لەبیر کردووە
قەسەم .. بە خودای گەورە
بە شینی ئاسمان
بە قووڵی دەریا ... بیابان
ئێستاش .. برژانگی چاوت
سەفین دەجوڵێنێ
تۆفان دەفەوتێنێ
ئێستاش ماوم بە یادی جوانیت
لە بەهەشت دەتبینم

28/2/2014

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

بیستوومە ... دەڵێن
ڕەنگی چاومت لەیاد چووە
ئەو چاوانەی ...
کە هێز و توانای لێ شاردرایەتەوە
فرمێسکەکانی .. بارانی بەهاری ژیانمە
هەموو شتەکانم ..
لەبارانی فرمێسکەکانی ڕوواوە

28/2/2014

قیمەتی دڵۆپەکانی ئاو
ئەگەر بزانی
ملیاران ساڵە لە تەمەنی
ملیۆنەها ساڵ ماوە لەناو دەریا
چوویتە ناو زەوی
بوویتە ماسی و حووت
گەڕایتەوە بووە باران .. خوێناو
چوویتە لەشی مەل .. بەرد
ئازاد بووە .. هەڵگیراوە
ئەم دڵۆپەیە مێژووی خەڵقی خودایە
پیرۆزە ... بیپارێزە

2/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئاشتی... بەهەشتە

27/3/2014

## مامـۆستا ئەڵێ

هێزی خودا
ژیان .. و .. وزەیە

27/3/2014

# مامـۆستا ئـەڵێ

ژیان .. ڕێکخەری وزەیە
وزە .. دروستکەری ژیانم ..
و هەموو جۆرە ژیانەکانە

27/3/2014

## مامۆستا ئەڵێ

ژیان لە کوردستاندا
بە ئاستی عەقڵی کوردستانیان
ئینجا دەبێ بە ژیان

30/3/2014

خۆزگە هەموو خۆزگەکانم
ئەبوونە ڕاستی
سەهۆڵی ڤولکانی ناخم
هەڵمی گرت بەبێ هەستی
چوویتە ژێر ئاڕاستەی
بێ هەستی مەبەستی
مەبەست نەبووە هەست
هەست خۆزگە ی
خودانی مەست

7/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵووز ... هونەر
هانی خەڵووز دەدا هونەر
دەسوتێنێ ... گەرم دەکا ...
دەوروپشتی نەرم دەکا
بێ  ئەوەی بزانێ هونەرە

7/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

چاوم ... چاوم
چاوە جوانەکانی .. چاوم
هەموو پێکەوە هەڵبەستن سازی
سازگاری جوانی خەڵاتی دونیا و قیامەت

7/3/2014

# مامـۆستا ئـەڵێ

خودایە .. ئاگرت ساردکەی
ماڵم ... ئاوەدان کەی
خاکم ... باران کەی
بارانم ... بەرەکەت کەی

7/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

دەرد .. و .. دەرمانم
لە یەکتر ... تۆران
بێ دەسەڵات دەرمانم ...
دەردم .. ڕوا

7/3/2014

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

پێم دەڵێن
چییە بەڵگە ..
بە بوونی ..
دەڵێم چییە بەڵگە
بە نە بوونی ...؟

7/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

هەندێ دراوسێمان
خاڵ .. و .. مامن
هەندێکیشیان .. ژەهری مارن

7/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خاوەن وڵاتم
وڵاتم خاوەنی نییە
مەدە .. بە هاوڵاتی
حوکمی ... خاوەنداری

7/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

ساوایە ... بەهرەوەری ژانی ژیانم
لەژێر خاك ... ئاو هەڵدەقوڵێ
كانی ... و ... شەپۆل
لە ناو خۆم
لە دەرەوەی خۆم
بەرماڵی .. ماچ دەكەم

7/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خوێن لە هەموو گیانلەبەر سوورە
دەلالەتە هەموو ژیان یەکە

7/3/2014

## مامــۆستا ئەڵێ

کاکە ... ببورن
لە ئاسمانەوە دەتانبینم
هەموو یەکسانن

7/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەو خوێنەی ڕژا
لە ژێر بەردی سەفین
ئەو خوێنەی خنکا
لە ژێر پەتکی قین
پیرۆزترە لە ژین
لە لامان .. و .. لای خوا

7/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ڕەنگی شەراب .. و .. خوێن
سوورن
یەکیان دەژیێنێ ژیان
ئەوی دی خەیاڵی گیانەوەر

7/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

ئاگر .. ئاگری دەخوا
ئاگر .. ئاگر ئەکوژی
دار ... بەرد .. هەوا ...
دەخوا ئەم ئاگرە

7/3/2014

یادی ئازار
چل ساڵە برینەکانمان کولاوە
12 مانگی پێچووە تا کوژاوە
هێزەکانی نەدیتراوە
دیتیان میللەت سووتاوە
سێیەم جاریش
فرۆشتیان ... نەدیتراوە
ئەمە ڕوویدا لە وەرزی بەهار
خوێن مەیی لەناو دەمار
11ـ3ـ1974 / 9ـ3ـ1975

11/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئای ئەفەندی
دوێنێ بووی سێبەندی
وا دەزانی بەندی
نا .. یا ئەفەندی

22/5/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

دیارە نەبووە قیسمەت
لە گەڵ ژیانی ئاوێتە بم
لە ڕەشایی چاوی
بزر بم
بۆچی ؟
نەبووە قیسمەتم

12/2/2014

ئادار ... مانگی نەورۆز
ڕووناکە و تاریکە
لە خەڵاتی ... بیر و بڕوا
ئەگەر بیر ڕووناك بێ
تاریك بێ بڕوا
یا بڕوا تاریکی ... بیر روناك بێ
شینایيیە لەناو ناخی ماخولیا
کۆمەڵ ئەژی لە تاریکیی بیر ... بڕوا
نازانێ ... ڕەگی .. بیر و بڕوا
بۆیە ... دەسووتێ؟!
بەئاگری؟!

6/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

به هەویری ئازارەکانی ئادار
شێلاوم
ئاداری 1975 ... ساڵی 1991
ئاداری 2015
له هەموویان سەختربوو
دەمانهاژووشت
بۆ سەیرانی ... خۆ ڕوخاندن؟!
کوردینه .. کوردستانینه
خۆتان .. بپارێزن ؟!

# مامۆستا ئەڵێ

ئادار ... زستان ... بۆ بەهار
ئەسوتێنێ بەفر
ئەلەرزێنێ دەفر
خۆشی و ناخۆشی
بومە لە رزەیە ...
شەپۆلی سارد و گەرمە
دەفڕێ بۆ ئاسمان
لە هەموو زەمان

6/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئادار مانگی دەرد و خۆشییە
مادام بەهار بێ زۆر خۆشییە
دەردەکانی ئەتوێتە وە لەناو
ناخۆشییەکان
بۆیە نەورۆز بەهارە خۆشییە

6/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بمسوتێنن .. لە نەورۆز
سوتانم .. بەهارە

16/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بڕوا .. دەکەن
دە ساڵ – چووم – هاتم
دەرگای جیرانێکم نەدیت
بەکراوەیی ..
دەرگایەکی .. شین
ئێستاش نازانم بۆ ؟!
قەڵای هەولێر داخراوە ...
داخراوە بۆ !

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

چوومە ناو شوورەی ئەستەنبوڵ
شاری کەون .. ڕێگای تەسك
کەونی هەزاران ساڵ
ماوە لەناخی منداڵ
منداڵێك پێی وتم
چی ئەکەی پیرە ... بۆ کوێ ئەچی ؟
خۆمم بە بیر هاتەوە لە منداڵی !
ئە مپرسی ...
بۆ کوێ ئەچی ؟
چیت هەیە ؟

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

جوانە ... ژیان بە جوانی
سامانە ژان ... بۆ ئاوەدانی
سەربەستە بۆ چاوەڕوانی

26/4/2014

# مامۆستا ئەڵێ

کۆبانێ ... خۆماڵی
دەروازەی ... دەریای سپی
بۆ کۆماری کوردستان

27/3/2014

ئەمەوێ خۆشەویستی درووست بکەم
مۆدێلی حەفتا ساڵی
هەموو مەنجەڵەکانی خۆشەویستیم
پڕ پڕە بە بێ قەپاغ
هەموو دەروونەکانم بەتاڵە
بۆ خۆشەویستی
بەڵام قەپاغی مەنجەڵەکەی بەستراوە
هەڵمەکەی ئەسوتێنێ

27/3/2014

هەموو ... هەموو
چەشنێکی شەپۆلە
ڤولکانی ژێر زەوی
شەپۆلی ئاوی دەریا
فڕینی هەوا ... لەناو هەوا
بوومەلەرزەی ئەلیکترۆن لەناو ئەتۆم
شەپۆلی ژیانە ..
درووستکەری ژیانە ..

29/1/2014
هەولێر / ماڵ دریێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

کەروێشك مامۆستای
پاراستنی ژیانە

22/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

کەروێشك ...
ماڵی ژێر خاکی ... چار دەروازەیە
ڕێوی ... گورگ
دەروازەکانی
پێ هەڵئەبەستی

22/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

دوو کەر
چار .. گوێ
سەدان ددان
ئەسوتێنێ دڕایەتی
سوڵتان

22/10/2014

مرۆڤ .. فکر نەکا پێش ناکەوێ
فکر .. فکر دروست ئەکا
هەست ئەجولێنێ
پێشتر فکر راست بوو
یەك خودا یاسا بوو
لەداهاتوودا
یەك فکر
یەك خودا
یەك خوڵقاو
ئاینی مرۆڤایەتی

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەمڕۆ رۆژی ئاڵای کوردستانە
جوانترە
لە شەهیدبوونی
کاك بەختیار
چونکە بەختیار شەهیدبوو
بۆ بەرزی ئاڵای کوردستان

17/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەمڕۆ رۆژی ئاڵای کوردستانە
گریام لە کەیفان
زیاتر لە گریانی
خەمی مردنی دایکم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

شمشێری شێر
ددان و نینۆکیە تی
شمشێری خۆر
وزەو تیشکیە تی
شمشێری مرۆڤ
بیرو بڕوایە تی

15/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

کەنگری بەهار
لە پایز و زستان
تامی وەك یەك نییە

15/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خەریکە خەون ئەبینم ..
سەر .. بەستی
بەستی خەون ئەکا

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خەونێك ئەبینم
لە یادم لە مێشکم
هەڵئە بەستم
بەڵام نایبینم

12/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری سەیرانی
سەیوانی  سۆرمان
سەیران ...
سەربەرزان
سپی زان ...
خۆرا .. ئاسان ..

14/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگە ئەزانم
چیە گوناهم

14/5/2014

# مامۆستا ئەڵێ

کلاشم ... شەبقەم
کامیان بەسوودە ؟

14/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

دەربەدەرم ... ڕۆڵە
پاڵاوتنی ڕۆڵەکانم
دەربەدەرم ئەکا

5/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

هەمیشە ... هەموو
هەمووی ... هە موو
هەی سندان .. رووبەڕووی هەموو

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

هەڵگری مەشخەڵی
کۆماری کوردستان
لە شێخ سەعیدی پیران
عەبدوسەلامی بارزانی
مەلا موستەفای کورد زان
بۆ سەروەران
کوردستان پەروەران
بۆ پێشمەرگەی
پاراستنی .. ژیان
بەیداغی ... ڕۆژ

14/12/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

هەردی ... هەڵمەتی
هەنگین ... هاندان
هونەری ... هەناسەگیران
هەوڵی ... هاواری
هەینی .. هەینی

14/12/2014

# مامـۆستا ئـەڵـێ

کورد بەزۆری بەپیتە
فارس .. عارەب .. تورك
کوردایەتی ئەبینن
دڕندایەتی ..
خودی خۆیان ئەکوژێ

# مامــۆستا ئەڵێ

هەوێتی ماستی
هەویری گوڵاڵەی قەدی سەفینی
شەونمی پەیکەری ڕێواسی
پەنگری ڤۆلکانی ناخمی
گەلاوێژی ئەستێرەی ئاسمانی
بەهەشتمی ..
خۆشەویستی ..
سۆزانی ..

24/11/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

گرنگی سەربەخۆیی
لە ئازادی بەسەنگترە

13/10/2014

خۆری ... خودا
هێزی دروستکراوی خۆیەتی
له خولقاندنی .. رۆژی .. رۆژان
له سارد کردنی
بەفری .. بێ ڕۆژی
ژیانلەبەری ... ناو ژێر سفری موتلەق
هەمیشە .. لەناوەوەم تەقینەوە هەیە
خۆشی ... خۆشەویستی

13/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگا ... خۆزگا
بژیابام ... لە مردن
بمردبام ... بۆ ژیان

10/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەمن ئەمرم
تۆ ئەژی
مردنم ... و .. ژیانت
سوودی .. چییە ؟
بۆ .. چییە ؟

27/3/2014

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

پێت ناوەستم
ئەی مەبەستم

10/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

ڕاگری مەرگم
مەرگی ... منە

10/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ماڵی خودا
دەروازەی نییە
لە هەموو لایەکەوە
دەرگای کراوەیە

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

ئێمە کوردین
غەدر لەکەس ناکەین
هەندێك غەدریشمان لێ بکرێ
دەنگ ناکەین

27/3/2014

# مامـۆستا ئـەڵێ

سەپانی شێخانی
خولامی ... هاوڵاتیان
دەربەندی ... ئاغایان
کۆئەبنەوە
بۆ دروستکردنی
مەشخەڵی هەستی ..
وڵات و شارستانی

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

سەربەستی ... لە خۆپەرستی
بەدەستی ... بێ مەبەستی
هەستی ... دیلی

27/3/2014

## مامۆستا ئەڵێ

توورە مەبە
توورە ...
مێشکت .. لە هەردووکیان
بپارێزە ...

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکانم ... لە هێزی
بێ هێزی مەرگەکانم
هیشك بوو .. چاوم
بە فڕینی بە باڵ
بە نەفڕینی بەباڵ
گەڕامەوە ... بۆ.. خەونەکانم

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

دەردم نییە
جگە دەرد ... لە مردن

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

گەرچی ... خوێتم
ژەنگی هەڵهێناوە
چۆکم ... گیراوە
بەڵام .. خۆشەویستی
لێ ... هەڵگیرساوە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سەنگەری زانست
بە زانین و ... توێژینەوە
ئەبێتە ... خۆشەویستی

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

تکایە قبوڵم بکەن
بە قوتابیتان
لە ئێوە فێر ئەبم
خۆشەویستیتان

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری مەکەن خوێناویە
ڕابردوومان
سەیری خۆشەویستی
و قبوڵی یەکتر بکەن
لە هەولێر
ئەبێتە .. مایەی
شانازیمان

19/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

له مێرگی گۆڕستانی مەرگەکان
ئەخولامەوە
له دوای مەرگی خۆم
بەڵام نەمدۆزیەوە
بۆ؟ ... نازانم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

پەل پەل
گەڵای پایزم
هێدی هێدی هەڵئەوەرێ
بە زریانێك ... بە بارانێك
ڕووت ئەبێ
بەڵام نامرێ
بەهاری دی ... لێ هەڵئەقوڵێ

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی پەنگری
خۆبەخشیی
ئاواتی ... سەربەستی
خۆشەویستی سەربەستیمە
سەربەستیمە .. خۆشەویستی

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی قەڵای هەولێرە
خانەقا .. و .. تەعجیل .. و .. تەیراوە
ئێوە ... نازانن
چی قەڵای هەولێرە ...

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی
دەرگای بێ دەرگایە

27/3/2014

## مامـۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی نێر و مێ
لە هەموو ... گیانلەبەر روایە
دروستکردنی خەڵقی خودایە
بۆیە خۆشەویستی
پیرۆزە .. پیرۆزە

27/3/2014

# مامـۆستا ئـەڵـێ

خۆشەویستی خودایە
مەبەستی ...

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی ...
خەڵوزە ... بەفرە
ئاوە ... هەورە
ناخە ... هەوایە
دوژمنی ... قینە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی ئاڵایە
ویستی .. خودایە

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی ...
پێویستی سەربەستی
ئاو .. هەوا .. خۆڵ
ئاگر ..
چوارچێوەی مەبەستی
هەڵسەنگاندنی خۆشەویستی

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی کارە ...
رەوشتە
خۆبەخشە
نەویستە ...

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خودام خۆشئەوێ
با هەموو .. ئامانجم بزانی ..
هەرچی ... دڵنیام
لە دڵم زیاتر ئەزانی

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی ...
نیە دوژمنی
دوژمنیشیان ...
لەچوارچێوەی خۆشەویستییە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی وەکو مۆسیقا
نزم ... نزم
بەرز ... بەرز ... ئەبێتەوە
ئاهەنگ ... لەناخ
ئەگرێتەوە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی .. ئی خودایە
ئەیداتە ... خۆشەویستانی خۆی
و .. ئەوانی تر

27/3/2014

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

خۆشەویستی مەبەستی
جوانی ... ڕەوشتی
تا بگاتە ... صفات الذات

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی لە بەهارە
خۆشەویستی لە پایزە
پاش مردنیش
بۆنی پرچت ئەکەم
لە گۆڕ .. و .. لە ژیندا

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

دیلی مێشك
وەکو مشك
پەت ئەقرتێنێ

27/3/2014

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

دیلی خۆمم ...
لەناو خۆم ...
هەتا نەفڕم
بۆ دەرەوەی خۆم

**27/3/2014**

# مامۆستا ئەڵێ

دیلی خۆشەویستی
ئاوازی پێویستی
ژیانی ... ڕاستی
لە دەرەوەی ژان

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

دیلی دەروون
ئازادی بەرەڵڵا
دوو سەری پەتکی سوتاون

27/3/2014

# مامـۆستا ئـەڵـێ

سەرسامی دیلی دونیاو
قیامەت
نەپۆشینی ...
بەختیاری ...
جەلالە ت ...

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

## دیلی دونیا و
## پێداویستییەکانی
## ئازادی دادەپۆشێ

27/3/2014

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

خۆزگە ... شێت ئەبووم
باری شانم و مێشکم
سووك ئەبوو

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تووڕە ... تووڕە
تووڕە ... تووڕە
خۆرە ... خۆرە
بە هێزو ... سوارە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری مردووەکان ئەکەم
مردنم بە خۆشەویستی دەرئەکەوێ
مردن ... قۆناغی دووەم ئەگۆڕێ
قۆناغی سێیەم دەرئەکەوێ

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

جەنگ .. ناکەین
ناکەین .. جەنگ
جەنگاوەرین
بە جەنگ ... چاندمان
تەکنەلۆجیای ... زەمان

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

تەمبەڵی ...
تاوان ... نییە
دوو لایەنی کارە

27/3/2014

## مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

گەردەلولەی ... زەوی
بیابان
گە لاکسی
پاڵەپەستۆی .. بەرز .. و .. نزمە

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

سەبارەت .. بە دونیا
ڕووناکی بێ
ئێمە .. ڕووناکی ئەبینین
ڕووناکی نییە ... لە دونیا
تیشکی ڕۆژە ... لە چاوە

16/5/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سەیوان چەتری

ترس ... ئەڕوێنێ
ڕواندنی ترس
تیرۆریستی ... ئەچەسپێنێ

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ڕەشە ... ئەشكەی مەرگم
مەرگم ... لەناو مەرگی
ڕەش ... سپی ئەكەم
بە بڕوا ... بە مەرگم

27/3/2014

## مامـۆستا ئـەڵێ

سووره ... بەفری دۆزەخ
شەکره ... ژەهری زەخ
بیرو .. بڕوا
هێویتی ناڵخ

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئێمە پێڵاوی زانکۆین
وا دەبێ بیرو .. بڕوام
ئەگەر وا ... نەبێ
دەمبینی پێڵاوی خۆم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوزی زەرد ... ئە تۆم ئەسوتێنێ
ئاهی دەربەدەر
ناخ ئەگرییێنێ

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆم .. و .. خۆمەکانم
بە قوربانت بم کوردستان
خۆم .. و .. مناڵەکانم
بە قوربانت بم کوردستان
خۆزگا ... هەموو لە من زیاتر
خۆشیان ویستبای  کوردستان

27/3/2014

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

مامۆستا ...
سۆفی چییە
گیانە ...
ساف بونە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

چی بکەم لەم درۆیانەی بوونە حەقیقەت
لە خەیاڵیان .. نەبوون بۆتە بوون
من چی ؟ بوونم ... نەبوون
لە نەبوونی ... بوون
نەبوون ... بووەتە حەقیقەت

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

خودا ... چی مەبەستە
بوونی .. بوون ... لە دەستە
ئایا ... ئەبێ
شتی خۆی بیدەیتێ ؟!

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تەرازووی تەندروستی ساغ
دروستبوون و بەکارهێنانی لەشە
بۆ هەموو ... مەبەستێ

27/3/2014

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئێستا ... دونیا
هونەری تەکنەلۆجیای فرۆشتنە
زانست ... زانینی فرۆشتنە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سوپاس بۆ تۆ خودایە
لە برسی ... لە مەترسی
لە خۆشەویستی
سوپاس خودایە

18/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تەرازوو ... نەترازا
نەخلیسکا
ئەوانی ... ئەترازان
خلیسکان

14/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تەرازوو ...
شێوەی زۆر گۆڕاوە
بەڵام ...
ئامانجی نەگۆڕایە
و ... ناشگۆڕێ

27/3/2014

# مامـۆستا ئـەڵێ

تەرازوو ... پێوەر نییە
پێوەر ... کێشە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تەرازوو ... ڕابگرن
تەرازووی ئێستا .. قستاس نییە
پێوەری بەدەست تۆوە نییە
پێوەری ... دونیایە ؟!

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

چەندم پێ وتی ..
بە تەنیا ئەمێنی
سەرکێشیت نابێتە ڕەفیقت
هەڤاڵی تەنیایی
تەنیا ... بۆ خوایە
چەندم پێ وتی
وەرە بنۆشە
نیعمەتی خوایە

5/9/2014

هاتم و ڕۆیشتم
هەر ئەوەندە ... هەستم کرد کە ئەڕۆم
لە ڕۆیشتنم ... دروستم کرد ڕێگام
کە ئەوانیش ... بە پێ ئەڕۆن
ئە ڕۆن ... ئەڕۆن .. هەر ئەڕۆن
هەتا ... دێم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

وەرن بەرد بارانم کەن
نەکەن ... قوتابیان
لێ بدەن

9/2/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەی دەبابە تۆپ
پێی ناکرێ
بە قەڵەم ... کۆمپیوتەر
پێمان ئەکرێ
لەبیر بکەین
غرووری هێزی تۆپ

16/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

وایان لێکردووین ..
کە یفمان بە هیچ نایێ
لــە ناو جەهل و جاهیلان
هەناسەم نایێ
دزیمان لێ ئەکەن
و دەستمان دەبڕن

27/3/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

لێدان حەرامە
هەتا ... بۆ ئاژەڵ
چونکە نابێ ... ئازادی سەربەستی
ئەگەر بژین لە ژێر ترسی
دەستی ؟!

27/3/2014

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مەستەڕەی دەستم
بۆ ڕاستکرنەوەیە
نە ك بۆ ئازار و
ئەشكەنجە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بوەستە بۆ ئاڵا
مەبەستە

22/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تەباشیری دەستم
ئاڵای مەبەستم
داخوازی هەستم
رووناکی عەشقم

4/2/2014

# مامۆستا ئەڵێ

قوتابییەکانم وەك یۆرانیۆم
عیشق ... تیشك ئەکەن
من ... ئەسوتێم
من .. و.. ئەوان
رووناکی ئەدەین

4/2/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

شوێتی مامۆستایان ..
ئێمە ... مامییە
بۆ دونیا و
قیامەت

4/2/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

سەیرم کرد ... نەمدیت شێواو
شێواندم ... سەیرکردنم
نەمدیت .. سەیر

30/1/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەزانی بەرد پڕی ئاوە
هەروەك ئاو .. پڕی بەردە
هەموو شتێك
مەلە ئەكا .. لەناو ئاو
ئاویش ئەجوڵێنێ ژیاو ..

30/1/2014

# مامۆستا ئەڵێ

له گه‌نجی
مۆغانی پیر و گه‌نج بووم
له پیری مۆغانم
عاشقی گه‌نجانم

29/11/2014

# مامۆستا ئەڵێ

چاویان سوتاندم
بە ئاسانی ئەبینم
ئەو شتانەی ...
نەمدیبوو ... پێشتر

29/11/2014

# مامۆستا ئەڵێ

له چیا ... گورگ بووین
لەشار نەبووینه بۆی
نەمان توانی
گورگەکانی چیا
بکەینه بۆی شارستانی
بۆیه .. وه کو گورگ ماین
یەکتر ئەخۆین

27/1/2014

که ئەچمه ناو خۆم
هەندێك جار ناوم له بیر ئەکەم
چاوەکانم زەق
گوێیه کانم تەق
کاتی ئەوەیه ..
هەستەکانم بەکاربهێنم
هەسته بێ سنوورەکان
ئازاد ئەبن .. له ئازادی

27/1/2014

# مامۆستا ئەڵێ

من خولقاوم بە زانستی ئەو
بە کۆدی (DNA) .. دەستکاری ئەو
دەسەڵاتی .. خوڵقاندنی ئەو
ئەڕوا بۆ دروستبوونی ڕۆژەکانی
گەرم .. سارد
شەپۆلی دۆزەخ .. ئاوەدانی بەهەشت
لە نەزانینم .. دروست ئەبێ
هەموو زانینم
لە زۆر زانیم
ئەڕۆم .. بۆ نەزانینم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سەربەستییەکانم
بە یارمەتی خوا
چەسپاوە لە ناخم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

وادەزانم خوا
پێویستی بە نوێژی من نییە
من .. و .. منەکان
پێویستمانە

27/1/2014

# مامۆستا ئەڵێ

مێروستانم دی ئەمخوا
نەمخوارد
مەڕو ...ماڵاتم دی
نەیانخواردم ... ئە یان خۆم
ئەخۆم ... ئەخورێم
دەبێ ... وابێ

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

تەرازووی زانین ... دەروونی مێشکە
دەروونی مێشك ... ئازادی دەروونە
ئازادی دەروون ... بەندایەتی خودایە
بەندایەتی خودا ... تەرازووی زانینە

28/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سەربەستییەکانم
هەندێکە لەوانە ی
خودا پێی داوم
زۆریشیان بەکارم نەهێناوە

11/4/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بەڵێن دەدەم بە خودایەتی خوا
بیانپارێزم رەوشتی خەلقی
لە رەشبینی نەزانان

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆشی .. خەم
هیشك ئەبیتەوە ... لە نەبوونی

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

دەنگی ژەنگی مۆسیقا
دەنگە نوستووە کانی ناخم .. ئەکاتە سەما
مردووەکانی ناو لەشم .. ئەچنە سەما

29/12/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بە مۆسیقا ... ئەفڕم
ئەبم  بە هەور
ئەیگێڕمەوە  باران .. بەفر
تاكو ... ڕاوەستانی ژیان
بكاتە زیندوو

25/1/2014

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هەستی هەستکراو
هەستی هەستنەکراو
نەبینراو ..
وەك .. دوو قوتبی موگناتیس

15/1/2014

# مامۆستا ئەڵێ

سوتانی ڕۆژ
وەك سوتاندنەوەی ناو لەشی
بەیەك شێواز ... دانراوە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خودام .. چەند خۆش ئەوێ
لە خۆم .. و.. خۆمە کان
زۆر .. زۆر .. زیاتر؟!

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

دەربەدەری عەقڵ
لە کەم زانینی زانستە
لە قینە ...
لە غروری هەستی هێزە

27/3/2014

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

مامۆستا .. ئەچێنێ ..
ئەچێنێ .. بێ ئەوەی بدورێ
دورینە وە .. بۆ ئەوانی دی
بە جێی ئەهێڵێ

13/11/2014

# مامۆستا ئەڵێ

جوانی ڕەوشتە
زانینی ... مەبەستی

13/11/2014

# مامۆستا ئەڵێ

کاکەی دەوڵەمەند
بزانە ... فەقیری ئیفلاسی نییە
ئەمەش هێزێکی دەوڵەمەندە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ژانی نەبوون ... لە نەبوونی سانایە

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خۆفرۆشەکان ..
کرێیان بازاری .. هەرزانەکانیان
فرۆشتیان .. یاران
بێ ئەوەی بیزانن

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

خەرمانی ... کۆنە کانم
خەستترە ... لــــــە
ڕواندنی دەنکە گەنمەکانم
شەپۆلی کارە کانم
سەربەستترە ... لە بێ دەسەڵاتەکانم

27/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

گوناهەکانم
لەناو هەڵمی حەڵاڵیان .. گڕی گرت
حەلاڵ ... حەرام
بوویتە پێویستی پێویستییان

11/11/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

سەردەمێك ... بوو
دەمم ... بە لێوی شاد نەبوو
كە لافاوی ... خۆشەویستی نەبوو
ئاگری ... گە رمان زۆر بوو
لافاوی خۆشەویستی
بۆ .. نەبوو

9/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

زانکۆ ... بە تەنیا فێر ناکا
بەڵکو ... فکر ئەکا
پلان .. و .. ستراتیژی
داهاتوو ... دروست ئەکا

9/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

لە فرتەنەی شەپۆل
پاپۆڕمان چۆن ئەپارێزین
بە سووك .. و .. چالاككردنی
چاك بەڕێوەبردنی

نیویورك

# مامۆستا ئەڵێ

ڤۆلکانی کوردستانی
بەفری پێویستی ئازادیە
ئەمرین لە سەرما
ئەژین  لە گەرما
ئەژین  ئەمرین ..
بۆ ئازادی

11/3/2014

نینۆکی ... پەنجەی پێتم
لە سەیوانی بن ساماڵی ئاسمانت
بە تەنیا ئەفڕم
گەرچی ... پێویستم
بە فڕین نییە
بەڵام ... ئاسمانت سەیوانی
ساماڵی ... پێویستمە

11/3/2014

# مـامـۆسـتا ئـەڵـێ

قەدەح ... قەدەح
وەك دڵۆپەی فرمێسك ... ئەڕژێ
بۆ ... ڕووناك كردنی ناخی
بە بێ ... تاوان

11/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

کۆماری  کوردستان
بە شێوازی هاوچەرخی
تەکنەلۆجیای دونیاناس
پێشکەشی دونیا بکەین
دروستی بکەین
هەوڵ بدەین بەخێوی بکەین
ئازادی بکەین
نمونەی ئاشتیخوازی بکەین
بە شێوازی مرۆڤایەتی

12/3/2014
شتوتگارت / ألمانیا

# مامـۆستا ئەڵێ

له وڵاتی ئازاد
ئازادی سەربەستە
سەربەستی ... یاسایە
یاسا ... بەرژەوەندی
هەموانە

12/3/2014
شتوتگارت / ألمانیا

# مامۆستا ئەڵێ

کوردستان دروست ئەکرێ
بە شێوازی کوردستانیەتی
بە دەوڵەمەندکردنی دونیا
بە کەلتوری کوردستانیەتی
ئێمە مەڵبەندی دینی خوا
لە ئایینی ... لە زەردەشتی
و حەوانە وە ی ... پێنج دانەیی
بۆ فکری مەسیحیەت
وەرگرتنی ئاینی ئیسلام
بە ئاشتی ..
حەقمانە ..
ببینە مەڵبەندی کۆبوونەوەی
خوداناسان
بە ڕەوشتی جوان

**12/3/2014**

مطار شتوتگارت

# مامۆستا ئەڵێ

با ... هەموومان
بنۆڕین گوناهمان چییە
ئاڕاستەی جیهانی ئازاد بکەین
بە تەکنە لۆجیای هاوچەرخ
بە ئاشتی ...
بە زانینی ...
ڕێگای سەربەستی جیهانی
داوا بکەین ...
بەس ... دروستکردنی وڵات ..
و سەربەخۆییمان
ئەوێ ...

# مامۆستا ئەڵێ

دژایەتی کەسمان ناوێ
ئەمانەوێ خۆمان بەڕێوە ببەین
ئایا مافمان هەیە ؟!
ئێوە هەموو ... هەتانە
بۆ ئێمە نیمانە !
یاریدەدەرمان بن
دروستی بکەین

12/3/2014
شتوتگارت

# مامۆستا ئەڵێ

ئازادی .. و .. سەربەستی
دونیایان ... بەینە

12/3/2014
شتوتگارت – ألمانيا – مەتار

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مام .. بە ... بۆ زۆربەیان
وەستا .. بە ... بۆ هەندێکیان
مام .. و .. وەستا .. بە
بۆ ئەوانەی ئەبنە
مامۆستا ...

12/3/2014

جێرمان ... ژاپۆن
خۆیان بە بیست ساڵ
دروستکرد
کوردستان سەد ساڵە
دەڕوخێ
ئێمە .. و .. دوژمنانیشمان
خەتا ... لە ئێمەیە
یان دوژمنانمان
هەردووکمان

12/3/2014
شتوتگارت - اسطنبول
طائرە

# مامۆستا ئەڵێ

جوڵاندنی ... ناخی داپیرانم
پێویستە
دایك ... كچ ... نەوە
نەك قسەفرۆشان

12/3/2014
NYC.

# مامـۆستا ئـەڵێ

تەکنەلۆجیا
دایکایەتییە

12/3/2014
شتوتگارت–اسطنبول
NYC.

# مامۆستا ئەڵێ

ئامانج دابنێن
فکری لێ بکەن.
پلان دابنێن
کاری بۆ بکەن.
هەتا ... بە دەستی دەهێنن
چاکسازی بەردەوامی بۆ بکەن.

12/3/2014
NYC.

# مامۆستا ئەڵێ

داروین ئەیزانی
ژین دروست بووە بە زانست
ئایا ... ئەیزانی
دروست بوونی زانست
لە بێ سنووری زانین
تاریکستانە ...
هێدی هێدی .. ڕووناکستانە

**12/3/2014**
**NYC.**

## مامـۆستا ئەڵێ

خەونەکانت بە دی بێنە
بفڕە ... بە باڵەکانت
و بە فڕۆکە ...

12/3/2014
NYC. USA

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگە ... مامۆستایەتیم
بە وەستایی پێ ئە کرا
حەیفە مامۆستا بیت
ئەگەر نەبیە
هەم ... مام ...
هەم ... وەستا
باش وەستای باش

12/3/2014
NYC. USA

# مامۆستا ئەڵێ

لە ئێستاوە ... دەست پێ بکەین
دوێنێ .. و .. ڕابردوو لە بیر بکەین

12/3/2014
ماریوت طابق View47
نیویورك – أمريكا

# مامـۆستا ئەڵێ

زوو بنوون ... زووش هەڵستن
ڕۆژی بکەنە سێ بەش
کارکردن
خۆشی ژیان
بۆ نوستن ... خواردن

12/3/2014
ماريوت طابق47 مطعم View
نيويورك – أمريكا

# مامۆستا ئەڵێ

## خەندە ... گوڵی ژیانە

12/3/2014
ماریوت طابق View47
NYC، USA

# مامۆستا ئەڵێ

فێربوون .. کارە
فێرکردن .. ئەرکە

12/3/2014
ماریوت طابق View47
NYC, USA

# مامۆستا ئەڵێ

قەسەم ... بە قانونی
قەیوانی ... قەسەم
هەردەم بکەم قانون
قەیرانی قەسەم

22/5/2014
دبی

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

قەسەم ... بە قاسمەکان
لە دەرەوە .. و .. ژوورەوە
دەڕۆن
قاسماتیان قەسەم
ئەکەن

# مامۆستا ئەڵێ

مۆسیقا ...
ئاوی ناو لەشم ئەتەزێنێ
نارەحەتی مێشکم ئەحەسێنێ
خۆشەویستی شیعر ...
لە ناخم ئەپرژێنێ

17/6/2015
اسطنبول/تقسم

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکانم ..
دەربەدەری نییە
لە ئازادی ئازاد بوون نییە
لە مردن قوتار بوون نییە
خەونەکانم ..
شیر ... بۆ منداڵی دایك شیر نەبووی
دە فتە ر .. و .. قەڵەم .. و .. قوتابخانە ..
بۆ هەموو منداڵانی زەوی
بە ئاینتان خەونم
زەحمەتە ...؟

مۆسکۆ

# مامۆستا ئەڵێ

من ... كه ... باوك
هەروەك تەشریفاتی قەسری جمهوری
هەركەس ... دێ
دەخوا ... و ... دەبا .. و .. دەڕوا

20/7/2014
هاید پارك / لندن

# مامۆستا ئەڵێ

بڕیار ... مەدە
کاتی توڕەیی
چونکە ..
مێشك ئەو کاتە
یەك لا .. بە توڕەیی ئەبینێت

20/7/2014
هاید پارك / لندن

چیمەنی ... کوردایەتی
نارِوێ .. لە خاکی گۆڕینی سەرکاری
سەرکارێکی کارزان
نەستەقترە ...
لە ئارەزووی ساختەکاران

29/8/2014
دوو شەممە
شتوتگارت-المانیا

# مامۆستا ئەڵێ

دەغڵی باخچەی گوڵی کوردان
گوڵەکانی کوردستانی لە زەق داوە
دەغڵ .. خۆیان بە گوڵ داناوە
خۆیان بە گوڵپەروەر .. ئەزانن
ئەوان دەغڵی بە زیوانن

29/8/2014
دوو شەممە
شتوتگارت-المانیا

خەڵوزی ... داری سوتاو
ڕەشایەتی ... ئەچەسپێنی
نەشیسوتێنی ... ڕەشایەتی
ڕەش ... دەبێ
دیکاربۆنایزەیشن ببێت
هەتا ... ڕەشایەتی نەڕوێتێ

29/8/2014
دوو شەممە
شتوتگارت-المانیا

(1)

کۆماری کوردستان
بە پەیوەندی ئە ڵمان
سازی داوە
بە دیموکراسی ئەمریکان
پنجی ... داوە
با کۆماری کوردستان
ساز بێت ... بە دیموکراسی داخوازان

29/8/2014
دوو شەممە
شتوتگارت- المانیا

# مامۆستا ئەڵێ

(2)

ئەڵمان ... وڵاتیان دروست کرد
به سەدان ساڵ
به شێتایەتی .....دروستکردنیان ڕماند
دیسان .. به پەنجا ... ساڵ
دروستیان کرد ...
گەلێکی ... خۆ دروستکەرن
خۆیان ... بۆ خۆیان
ناکەن ... خزمەتی ... بێگانه

29/8/2014
دوو شەممە
شتوتگارت-المانیا

# مامۆستا ئەڵێ

11ی ئەیلول .. کێ کردی
ئەمریکییەکان ...
یان ئەوانەی ئەڵێن
من ئەڵێم .. هەردووکیان

11/9/2014
هەولێر- فرانکفۆرت / فرۆکەی عیراقیە

**11ی ئەیلول ... چی بوو**
**جەنگ ؟**
**یان بۆ ژیاندنەوەی سەرداری !**
**من ئەڵێم ... هەردووکیان**

**11/9/2014**
**هەولێر-فرانکفۆرت / فرۆکەی عیراقیە**

11ی ئەیلول
تەتبیقاتی حەقیقی
یاری ئەتاری بوو ..!
فکری جەنگی تەقلیدی
تەواو بوو ...
یەك جەنگاوەر
یەك بڕیاردەر
یەك دروستکەر

11/9/2014
هەولێر- فرانکفۆرت / فرۆکەی عیراقیە

**11ی ئەیلول**
**ئەمریکایي ... لە تونێلێکی**
**داخراو ... ئەخلیسکێنێ !**

**11/9/2014**
**هەولێر-فرانکفۆرت / فرۆکەی عیراقیە**

# مامۆستا ئەڵێ

11ی ئەیلول
پشکنینی ... فکری ئەدەبی
توێژینەوەی ... زانستی
چارەی دەروونی
لێبوردنە دەرمانی
یەك جیهان
یەك هاوڵاتی
یەك شارستانی

11/9/2014

# مامۆستا ئەڵێ

مام دەروێش
* دەردت .. یان .. ڕیشت
چەسپاندی .. خۆ بەختەوەریت
* یان .. بڕوای بیری بێ سنوور
لە ناو بیری .. بێ ئاو
* یان ... سەمای فریشتە
لەسەر ئاوازی ... خاو
* یان.. عەشقی یەزدان
نازانم .. من مامۆستام .. تۆ دەروێش
* یان .. من .. هێدی ... هێدی
ئەبمە ... دەروێش ..؟!
مامۆستا .. هەر .. تۆی

ماڵ درێم سیتی
12/9/2014

# مامـۆستا ئـەڵێ

سامانی جیهان
سەروەری خۆبەخشی
خاوەنی بیر .. و .. بڕوای
پەخشان

30/9/2014

بشکتاش- استنبول

# مامـۆستا ئەڵێ

سامانی جیهان
جیهانە وەری ژانی ژووان
سەرپەرشتیاری خۆیان
دەزگای ژینگەی .. مان

30/9/2014
بشکتاش-استنبول

# مامۆستا ئەڵێ

سامانی جیهان
خۆزگەی ... خوازی قەهرمان
قەهری ... ژان
بوویتە کارگێڕیی .. کارمەندان

30/9/2014
بشکتاش-اسطنبول

سامانی  جیهان
بوویتە ... پارە .. و .. پوول
هەرگیز ... ڕەوشت  .. و
خاوەنی .. خاوان
سامانی جیهان
تۆ .. نایبینی .. ئەوانی تر .. ئەکەنە ڕووان
سامان .. بۆ فرۆشتن نییە
سامان ... بۆ خەرمان
بۆ هەموان

30/9/2014
بشکتاش-اسطنبول

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سامانی جیهان
هەمووومان ... خاوەنین
و ... خاوەنمانە

30/9/2014
بشکتاش – اسطنبول

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

قەسەم .. بە قاسمانی
قاسمی ئە عظم المشترك
هیچ لانادەم
لە بەستنی قاسمی مشترك

شەرابی مێوژ
لە دیانا .. و .. هەریر .. و .. باتاس
لە .. دۆڵ .. و .. زوڕنای
زۆر ... زۆر ... خۆش
شەراب بووە .. بێ .. نۆش
هەتا .. هەتایی
ئەچێتە ناو ... ئاوی شەقڵاوە
بە بێ ... هیچ .. جۆش

2/10/2014

سالْی ... سالاْنی
ئارامی ... ئازادی
سەربەخۆیی ...
هەر سالْێك .... ڕۆژێکە
هەر ڕۆژێك .... سالْێکە
ئارامی ... ئازادی ... سەربەخۆیی
هەر یەك عەسرێکە

**2/10/2014**
استنبۆڵ

## مامۆستا ئەڵێ

وەك زەیتون .. چاو
وەك هەنار .. ناو
ناوی ... چاوم
زەیتون .. و .. هەنار .. و .. ناو .. ناوم

2/10/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوە ی ... بە ئەنگوچ
خۆڵی کوردستان
ئەکاتە کەرپووچ ...
وەك ... خۆڵی گۆڕی بابم
موقەدەسە ... لە لام

29/10/2014

مطار- انقره

**ڕۆژی هەڵوین**

**1– شەیتان ... هێزی نیە دژی خوا**

**بەڵکو خۆی ... خوڵقاندراوە**

**2– لە خەڵقی ... خۆی**

**دایناوە ... ڕەشا تی ... سپیاتی**

**3– مرۆڤ ... خوڵقاوە**

**بۆ .. تەرازوو ... کردنی**

**بۆ کاری شەیتان**

**یان ... بۆ ... پەروەردگار**

**31/10/2014**

# مامـۆستا ئەڵێ

هەندەك ... چاوەكانی چاوم
تان ... بووە
هەندەك ... كوێر بووە
كە خەیاڵی چاوت
دێتە بیرم
چاوەكانم ... لە ناو چاوم
ڕووناك ئەبێتەوە

1/11/2014
برتغال

# مامۆستا ئەڵێ

یەزدان ... خوڵقاندنەکانی
چاك ... ئەزانی
لە کوێ ... خوڵقاندیتی
وا ... دەزاندرێ
بەهەشت ... لە جیهانی زەمین
خوڵقاندراوە
بەخشراوە ... بۆ گیانلەبەرانی

با بینۆشین
هەروەك خودا فەرمانی داوە
بە خۆشەویستی ژیان
ژیانلەبەر ..
ئامانجی ... بەختیاری دروستکراوە کانی
چونکە خۆی ... بە خۆی
بەختیارییە ... بەختیارییە
خودا ... ئەزانێ
ئێوەش ... ئەمنیش

**3/11/2014**

**مدريد / لشبونە**

# مامـۆستا ئەڵێ

هات ..... هات
پڕ .... بە ئاوات
چوو .... نەیزانی
چی بوو .... ئاوات

3/11/2014

هات ... هات
بەڵام بە خۆی نەهات
هاتنەکانی ... هەنارد
هەناردەکانی ... بوونە دەسەڵات
بوونە ... کارەسات
بۆ دەربەدەرەکانی ... وڵات
گوناهبارانی بێ دەسەڵات
گوناهەکانی دەسەڵات

3/11/2014
لشبونە

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هات ... هات
بۆ ڕۆیشتن ... هات
چی بۆ هەیە دەسەڵات
نە بۆی هەیە ... هەڵات

3/11/2014
لشبونه-برتغال

# مامۆستا ئەڵێ

هات ... هات
به ئامانجی سەربەستی ... هات
نەیزانی زیندان ... خەڵات
بۆ دروستکەری ... وڵات
زیندانی ... ناوخۆو
دەرەوەی ... خۆ

3/11/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

هات ... هات
بە پانی ... دەربەدەری
هات ... بۆ هاتن نەهاتبوو
بۆ فڕین ... لە ناوە خۆ
بۆ ... دەرەوەی خۆ
گەرچی ... نازانی
بۆ ... هات
چۆن هات

3/11/2014
لشبونە – برتغال

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سەنگی ... خۆشەویستی
لە گەلاکسی ...
هەڵقولاوە

11/11/2014

برتغال / لشبونە

# مامـۆستا ئەڵێ

گەنجان ... هاورێیان
بە Youth failing
While we adapt failing
لە ئێمە باشترن
معاناتیان سەختە
ئێمە ... لێ راهاتووین
لە معاناتمان ...

1/11/2014
برتغال / لشبونە

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
ئایا ... دەردم
دەرمانی ... گەرەکە ؟
یان ... سەربەستی
بە هەستی

11/11/2014

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
ئایا ... دەردم
دەرمانی ... پێویستە
یان ... زانینی
هۆی ... بەسە

11/11/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

ئایا ... دەردم
دەردە ... یان .. بێ هەستە
یان ... لە بێ هەستی .. دەرد
دەردمان ... سە ختە

11/11/2014

# مامـۆستا ئـەڵـێ

کتاب ... دەرمانە
ئایا ... دەردم
نەبوونی ... کتابە
یان .. بێ هەستیم
لە کتابە ؟
پیت ... پیرۆزە
وشە ... نەورۆزە
دێڕ ... بەڕێزە

# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

پەڕ ... بە خوازە
کتاب ... پیرۆزی
بەرزی ... بەرزە پیرۆزە

**11/11/2014**
**هەولێر- ماڵ دریم ستی**

# مامـۆستا ئـەڵـێ

ڤۆلکانی کوردستانی
بەفری پێویستی .... ئازادییە
ئەمرین ... لە سەرما
ئەژین ... لە گەرما
ئەژین ... ئەمرین
بۆ ... ئازادی

11/3/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بیر .. و .. بڕوا
بیرو .. بڕوامان وایە
پابەندی ڕوناکی داهاتووی کوردستانین

د.نوزاد یحیی باجگر
9/11/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بیر .. و .. بڕوا
بیرو بڕوامان وایە ...
هەتا ماوە ڕۆژمان
ڕزگاریمان پابەندە بە ...
زانست .. و .. کار و بڕوا بەخۆمان

د.نوزاد یحیی باجگر
9/11/2014

بیر .. و .. بڕوا
بڕوام وایە هەموو سەخلەتیمان
لە نزمی داخوازی زانستمانە
بیر .. و .. بڕوام
تاکە ڕێی ئازادیمان
کار و زانست و بڕوامان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_11_2014
کلمە التخرج

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەم .. ئەوەی
منی .. ناوێ
زانست .. وانیە
هەموویانی ئەوێ
ئەگەر .. نەشیەوێ

د. نوزاد یحیی باجگر
24/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

شەو .. رۆژم
جیاوازە
شەو .. هی منە
روژ .. هی هەمووان
بەشەو .. ئەفڕم بۆ ناوخۆم
بەرۆژ .. بۆ دەرەوەی خۆم.

د. نوزاد یحیی باجگر
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

شەوو .. ڕۆژ
سوڕانی .. سوڕانمانە
ئێمە .. شەوو ڕۆژمان
کردیتە .. تەرازوومان
بۆ .. تایبەتمەندی .. کاتمان

د. نوزاد یحیی باجگر
24/8/2014
هەولێر

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

هەر .. كوردێك ( كوردستانییەك)
یەكەم بێ لە شتێك
ئینجا .. گشت .. یەكەمەكان
كوردستان ئەكاتە شتێك

د. نوزاد یحیی باجگر
25/8/2014
هەولێر

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

تۆو .. خودا
وەستایی مەکەن
ئەگەر .. نەبوونە .. وەستا.

د. نوزاد یحیی باجگر
25/8/2014
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

سەیری .. سەیران بکە
بیر .. لە لافاو .. بکە
ڕێگای ڕزگاری ڕێك بکە.

د. نوزاد یحیی باجگر
25/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

زۆر .. سوپاس
بەختیاری .. ژیانتان
ئاواتی .. منە
پەروەردگار .. وای خوڵقاندووین
ئەبێ .. بڵێین .. ئامین (ئامین)

د. نوزاد یحیی باجگر
25/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ژیان .. پینەی ناوێ
خۆی .. بەخۆی تازەکارە
ئێمە .. پینەی نەکەین
خۆی .. بەخۆی .. دروستکارە.

د. نوزاد یحیی باجگر
25/8/2014
هەولێر

سەرم .. ببڕن خوێنی لێ نایێ
چونکە .. خنکاوم
خوێنم .. مەییە
خۆم .. بەخۆم .. خۆم .. ئەکەم ئازاد
بەگەورە کردنی .. خوێنم
ئینجا .. لەخنکاندن بەرزترم
بۆ .. ژیان .. سەروەرم.

د. نوزاد یحیی باجگر
25/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

سەرم .. سوڕماوە .. لە سەرسامی
لەم نەخشەی بۆمان دانراوە
وەك .. كەر .. وەك سەگ
بەختیارین .. بە سوڕاندنی
بۆیان؟!

د. نوزاد یحیی باجگر
25/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

چۆنێتی چونی لێ بڕیارە
هەروەها بڕیاری چونی بۆمان قەرارە
چی بڕیارمان .. قەرارە
هەموو .. بۆمان دانراوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
26/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

تەوری .. چخماخچی
چرخی .. چرخراوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014

هەولێر

مەکەن .. ئاوارە
ئێمە .. هەموومان
لە وولاٚتمان ئاوارەین
لەناخمان ساواین .. ساواین
لەکارمان بێ توانایین
ئاو .. هەوا .. بۆ هەمووان
وەك ئازادی ..
سەیرم .. مەکەن
وەك ئاوارە
ئێوەش .. ئاوارەن
چونکە ئازادیمان
نەچەسپاوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

توانای .. توندی
بێ هێزی ... سەربەستییە.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کەم زانیین .. گوناە نیە
فیر نەبوون .. بەپێویستییەوە
نەفامییە .. نەزانییە

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ئەی ساوای .. ساواکان
ساوای بڕوام
بێ هێزی .. داوام
دەربەدەری .. بەربڵاو
چۆن .. کۆتان بکەمەوە
لەبروام.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوز .. ناسوتێنێ
بەڵام ئەترسێنێ

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

گاڵتە .. ئەکەم .. بە مردن
مردنیش .. گاڵتەم پێ ئەکا
هەردوو .. درۆزنین.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

بەختیاری .. بڕوا
ئازادی .. بڕوا
لەهەڵاتن .. بەرزترە.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

کارەساتی .. دەربەدەری
ناوخۆ .. و .. دەرەوەی خۆ
نزمترە
لەهەستی سەربەخۆ.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

ئەڵێن .. هەموو دونیا شەڕ بێ
بستەك لەمن دوور بێ
وا .. نیە
دەبێ .. دونیا .. پڕ ئاشتی بێ
هەتا هەموو بحەوێنەوە
هەموو لا بحەسێنەوە

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
هەولێر

# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

توندی .. سەربەخۆ
بێ سەربەخۆ ..
ئەڕوێتێ.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
ماڵ- دریم ستی

کارەساتی .. شەنگال
تازە نیە
دەیان جار .. ئاوارە بوون
دەربەدەر .. کوژراو .. بوون
بەڵام هەرمان
هەروەك .. مانی
مان.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
ماڵ– دریم ستی

شەنگال .. چیای بەرخودان ..
جوانی .. دروستکراوی .. خودایا
ئازاری .. دەربەدەری .. تیایا
هەموومان .. دروستکراوی
خوداین.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری .. تسۆنامی ژاپۆن ..
بومەلەرزەی چین .. بکەن
کاری .. هێزی خوڵقاندنی خودایا
بەڵام .. ڕوخاندنی شارستانیمان
بەداخەوە .. بەناوی ئایینی ئیسلامی خودا
ئاگادار .. بن ..
خەتای .. تاوانباران
دیار .. کەن
ڕەش .. و .. سپی .. لێك جیا بکەن.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
ماڵ– دریم ستی

سوپای .. چەسپی چاودێری
لەدەریای .. بێ وریایی
ئەفڕن .. بەلاشەوە
هەڵدێن .. بەچەکەوە
لە .. ترسی .. ترسەوە
ئەبێ .. بچەسپێ چاودێری
ترسی .. ترسناك .. ئەوەیە.

د. نوزاد یحیی باجگر
27/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ڕێویەکان .. گورگەکان
ئێمەیان کردیتە .. سەگی خۆیان
چی ئێمە سەگین
چی خۆیان.

د. نوزاد یحیی باجگر
29/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆژهەڵات .. ڕەشەتاریکە
ڕۆژئاوا .. تۆزو .. گەردەلولە
باکوور .. سووتانی بەفران
باشوور .. مردنی گیانلەبەران
گەلەکسی .. ووزەی راگیراو
بەئەستێران ئاگر باران
تەرازوی سەرپەرشتی
دەرچوو لە میزان

د. نوزاد یحیی باجگر
29/8/2014
ماڵ- دریم ستی

خودا .. فەرمانی داوە .. سیستەمی
داناوە
ژیانلەبەران ...
خۆشی ژیانیان پێ ڕاسپێردراوە
خودا .. تەرازو ... هێزی داناوە
ئەگەر .. ئێمە نەیزانین
یان .. کاری پێ نەکەین
خەتای خۆمانە.

د. نوزاد یحیی باجگر
29/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێم .. ئەڵێم .. وا ئەڵێم
هەتا .. هەتایە ئەڵێم
ئێمە دروستکراوی خوداین
نەك ئێمە بەناوی خودا
ببینە جەلادی
دروستکراوی خودا
ژیان ...
پێویستی بە جەلادی نیە

د. نوزاد یحیی باجگر
29/8/2014
ماڵ- دریم ستی

هەڵاتنم .. بۆ سێبەری سەمایە
مردنم .. بۆ ناسینی ژیانە
ژانم .. بۆ دۆزینەوەی ڕێگای هەرایە
بەڵام .. گۆشتی .. گیانلەبەر
بەناوی خەتایە.

د. نوزاد یحیی باجگر
29/8/2014
ماڵ- دریم ستی

خۆشیمان .. بووە بە دەرد
دەردمان .. بووە بە چی ؟ پاش مردن
با بژین .. ژیان
ئینجا .. ئەژین پاش مردن
بەمردنی ژیان .. پاش مردن ناژیتەوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
29/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

من .. شێتم
بەشێوازی خۆم
شێوازی شێتیم
بەڵکو .. ئاواتی
بەختیاری ئەچێنێ.

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ناسینی خودا
بەختیارییە
ناسینی .. ئامانجییە
مامۆستای .. مامۆستایان
ئەچەسپێنێ .. ئاوازیان.

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ- دریم ستی

بۆچی .. ئەی سەگ
زنجیرەی .. روانگەی فکرم
تیك ئەدەی ..
لەگەڵ .. تۆ .. ئەبم .. بەسەگ
هەتا .. بزانم .. هەستی ..
سەگ .. ؟!

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ– دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

خوێندنم .. خوێتی .. خۆمە
خۆم .. و .. خوێندنم .. خوێتمە
خۆزگا ... خودا
لێکمان .. نەکا.

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ- دریم ستی

نان .. ئاو .. هەوا .. خۆڵ
ئاگر .. بەفر ..
ڕەوشت .. زانیین .. هێز .. دڵ
ئاوەدان .. سەنگەر ..
دروستکەری .. دروست
لە سروشت.

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ– دریم ستی

زامم .. زەماوەندی .. زامداران
زانینم .. زانستی .. زانایان
زان .. و .. زام .. زامداری
زەماوەندان.

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ– دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هەرچی .. ئەڵێن بیڵێن
ووتار .. بۆ زانستە ..
بۆ زانینە ..

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

تەواو .. تەواو .. تەواو
گەرچی .. تەواو .. بوون .. نیە.

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
ماڵ- دریم ستی

# ژیاننامـــه

## د. نەوزاد یەحیا سعید خدر ئەلیاس محەمەد باجگر

١) لە رۆژی ٢٨ شوباتی ساڵی ١٩٤٨ی زاینی لە هەولێر لە دایکبووە.
٢) باوکی یەحیا سەعید باجگرە و دایکی مەکییە ئەحمەد سەمەد سەعدولایە، سێ براو و چوار خوشکی هەیە.
٣) قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی فەیسەڵییە و دواتر لە ئەربیل ئولا ئیبن خەلەکان بە زمانی کوردی تەواوکردووە، مامۆستایان ناسح داود لە (حساب) بیرکاری و فوئاد موعەلیم لەوێتەکێشان یەکەمین مامۆستای ئە و قۆناغەی بوون.
٤) قۆناغی ناوەندی لە دواناوەندی هەولێر خوێندووە و مامۆستا(مەکی) یەکەمین مامۆستایی خوێندنی ناوەندییەتی.
٥) قۆناغی دواناوەندی، لە دواناوەندی هەولێر تەواوکردووە، مامۆستا خەلیل عەبدوڵلا یەکەمین مامۆستای ئەو قۆناغەی بوو.
٦) لەپایزی ساڵی ١٩٦٧ لەکۆلێژی پزیشکی ـ زانکۆی موسڵ وەردەگیرێت.
٧) ساڵی ١٩٧٣ـ ١٩٧٤ خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات و دەبێتە پزیشك.
٨) ساڵی ١٩٧٤ـ١٩٧٥ دەبێتە پزیشکی نیشتەجێ و پاشان سەرۆکی پزیشکانی نیشتەجێ.
٩) ئەندامی بەشداری یەکێتیی نووسەرانی کورد بووە لەبەغدا ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١.

١٠) لەساڵی ١٩٧٥- ١٩٧٦ ڕاژەی سەربازی ئیلزامی دەیگرێتەوە و لە شار و شارۆچکەکانی (زاخۆ، هەولێر، ڕواندز) وەك پزیشکی سەربازی دەست بەکاردەکات.
١١) ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ وەك پزیشك لەگوندو ئاواییەکانی ناوچەی گەلاڵە خۆشترین ساتەکانی ژیان بەسەردەبات.
١٢) وەك پزیشکی پسپۆری گشتیی لە مستەوسەفی سێتاقان لەهەولێر دادەمەزرێ.
١٣) دەبێتە پزیشکی ئێمرجنسی لەنەخۆشخانەی کۆماری لە هەولێر.
١٤) دەبێتە پزیشکی ڕاهێنەر لە نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن و پاشان نۆرینگەی تایبەتی ئێواران دەکاتەوە.
١٥) یەکەمین سەنتەری نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن لەکوردستان و لە هەولێر دادەمەزرێنێ، لەگەڵ د. ولید خالد لەنەخۆشخانەی جمهوری ساڵی ١٩٨٢.
١٦) لەوەزارەتی تەندروستییەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵا - کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدیین ١٩٨٣.
١٧) ڕاهێنانی نەشتەرگەری دڵ وسیینگ لە - مدینة الطب - لەبەغدا ئەنجام دەدات لەژێر سەرپەرشتی مامۆستا یوسف نعمان ساڵی ١٩٨٣ و لێکۆڵینەوە لە پسپۆری نەشتەرگەری دڵ و سینگ ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٧ ، زانکۆی بەغدا – مدینة الطب، لە نهۆمی نۆیەم، چوار ساڵی لێکۆڵینەوەیی و ڕاهێنان لەوێ تەواو دەکات.
١٨) دوای تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە - مدینة الطب، کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغدا لەتشرینی یەکەم ساڵی ١٩٨٧ دبلۆمی باڵای نەشتەرگەری دل و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن وەردەگرێت.

١٩) دەگەڕێتەوە شاری هەولێر  وەك پزیشكی پسپۆری نەشتەرگەری دڵ وسینگ لە كۆلێژی پزیشكی زانكۆی سەلاحەددین دەست بە كاردەبێت.
٢٠) وەك پزیشكی پسپۆر لە نەخۆشخانەی (رزگاری) لە هەولێر لە سالآنی ١٩٨٧ـ ١٩٨٨ دەست بەكار دەبێت.
٢١) ساڵی ١٩٨٨ دەگوازرێتەوە بۆ كۆلێژی پزیشكی زانكۆی موستەنسەرییە، نەخۆشخانەی یەرموك، عیادەی پزیشكی تایبەتی خۆی لە بەغدا شەقامی مشەجەر، باڵاخانەی باقر ئەلباقر دەكاتەوە هەتا ١٩٩٦.
٢٢) ساڵی ١٩٩٦ ئەچێ بۆ توركیا و مێرسین.
٢٣) پرۆسەی هونەری شێوەكاری لە خانوی تایبەتی ـ ژوری وێنەكێشانی خۆی لە كۆمەڵگای سولی لە لێواری دەریای ناوەست دەسپێكردوە.
لەبواری هونەری تەشكیلی(٢٢٠) تابلۆی هونەری تەشكیلی كێشاوە.
لەبواری شعریشدا چەندین شیعری ئازادی كوردی و عەرەبی نووسیوە.
٢٤) سالێ ٢٠٠٣ دەگەڕێتەوە زێدی باب و باپیران لە شاری هەولێر، چالاكییە خزمەتگوزاری و بازرگانی و زانین و زانستییەكانی پەرەپێدەدات، لە تەواوی شارەكانی كوردستان و عێراق دا چالاكانە خزمەتگوزارییە زانسستیی و بازرگانییەكانی گەشە دەكەن.
٢٥) بەشداری دەكات لە پرۆسەی بوژاندنەوەی ئابوری و وە بە رهێنان لە كوردستان و عێراقدا.
٢٦) چەندین كۆمپانییای جیهانی لە دوبەی، مێرسین، عێراق، سریلانكا و بەریتانیا دادەمەزرێنێ.
٢٧) ساڵی ٢٠٠٧ زانكۆی جیهان ـ هەولێر دادەمەزرێنێ.
٢٨) سالی ٢٠٠٩ بانكی جیهان بۆ وەبەرهێنان لە عێراق   دادەمەزرێتی.
٢٩) قوتابخانەی جیهان بۆ سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی دادەمەزرێنێ.

٣٠) سەرۆکی ئەنجومەنی جیهان ـ بۆ ئاوەدانکردنەوەیە.
٣١) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری جیهان ـ بۆ خزمەتگوزاری نەوتە.
٣٢) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری خێرخوازی حاجی یەحیایە.
٣٣) دامەزرێنەری ئێزگەی رادیۆ و تەلەفزیۆنی جیهانە لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٨ .
٣٤) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ سلێمانییە لە ساڵی ٢٠١١.
٣٥) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ دهۆکە لەساڵی ٢٠١٣.
٣٦) دامەزرێنەری مەڵبەندی راوێژکاری و توێژینەوەی زانستیی و یاسایی جینۆسایدە.
٣٧) دامەزرێنەری یانەی وەرزشی جیهانە لەساڵی ٢٠١٠ .
٣٨) ئەندامی کۆمەڵەی جیهانییە بۆ نەشتەرگەری دڵ.
٣٩) ئەندامی کۆمەڵەی ئاسیاییە بۆ نەشتەرگەریی دڵ.
٤٠) ئەندامی ئەنجومەنی پزیشکان، رۆژنامە نووسان، ژووری بازرگانییە.
٤١) دامەزرێنەری کۆمەڵەی دۆستایەتیی گیانەوەرانە.
٤٢) دامەزرێنەری کۆمەڵەی پاراستنی ژینگەیە.
٤٣) خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری زانکۆی جیهانە.
٤٤) تا ئێستا دەیان کتێبی چاپکردووە، لەوانە: (ووشە دەچێنم، ازرع الکلمات ، في الله، الموت، پێشمەرگە، کوردستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا(١٠ بەرگ)، الالبوم فن التشکیلي ، زنجیرە پەرتوکی مامۆستا ئەڵێ ...).
٤٥) چەندین کتێبی تازەی ئامادەی چاپە لەوانە (ئاشتی، لیلا، هزر ...).
٤٦)سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمینداریەتی زانکۆکانی جیهانە (هەولێر، سلێمانی، دهۆك).
٤٧) سە رۆکی ئە نجومە نی ئە میندار یە تی زانکۆی (ئەربیلی نێودەوڵەتی)یە.

٤٨) دامەزرێنەری (ئەکادیمیای جیهان)ــە بۆ پەرەپێدان و فێرکردنی پیشەیی.
٤٩)کۆلێژی قەڵا بۆ دیراساتی ئاینی لە ساڵی ٢٠١٨ دادەمەزرێنێت.
٥٠) لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی وەبەرهێنەرانی کوردستانە.
٥١) ئەندامی رێکخراوی ئاشتی جیهانییە، رۆژی (٢٠١٦/٦/١٤) دەبێتە باڵیۆزی ئاشتی جیهانی لە کۆنگرەی ئاشتی جیهانی کە لە تونس بەسترا.
٥٢) پرۆژە ئایندەییەکانی بریتین لەمانە:
١) دامەزراندنی تۆڕی زانکۆکانی نێودەوڵەتی(International Network of Universities) بە مەبەستی بوژاندنەوە و پەرەپێدانی زانست و زانیاری لە نێو گە لاندا.
٢) کردنەوەی زانکۆ لەشارە گەورەکانی عێراق و کوردستان.
٣) خوێندنی مافی منداڵان و ئافرەتان لەقوتابخانەو زانکۆکاندا.
٤) بڵاوکردنەوەی پرۆژەی نا بۆ توندووتیژی خێزان، ئافرەتان، منداڵان.
٥) دامەزراندنی نەخۆشخانەی فێرکاری جیهان و پاشان کردنەوەی کۆلێژی پزیشکی و دەرمانسسازی و پەرستیارییە.

بڕوام وایە (تەنیا چارە ... زانین و کارە)

"The only solution is education"

پزیشکی ڕاوێژکارییە، هونەرمەندی تەشکیلییە، شاعیرو بزنسمانە.